# فێربوونی زمانی ئینگلیزی بۆ هەموو ئاستەکان






ئامادەکردن و وەرگێڕانی
خالد غفار نامق

| | |
|---|---|
| نـــــــاوی کتێب: | فێربوونی زمانی ئینگلیزی بۆ هەموو ئاستەکان. |
| ئامادەکردن و وەرگێڕان: | خالد غفار نامق. |
| نـەخشەسازی ناوەوە: | کۆمپیوتەری نارین (کامران رفیق) |
| نورەو سـالّی چــاپ: | چاپی دووە، سالّی 2020. |
| ژمـارەی سپــاردن: | (2063)ی سالّی (2013) ی پێدراوە. |


- - - - - - - - - - - - - - - - - - - - -

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی:

فێرخـوازان و خوێنـەرانی خۆشەویسـت فێربـوون و زانینـی هـەر زمانێك جگـە لـە زمـانی دایـك یەكێكـە لـە لایەنـە گرنگـەكانی زانسـت وزانیاری و پێشكەوتن و خزمەتكردن بە تاك و كۆمەڵگەو ئاشنابوون بە كلتوری ئەو وولاتـەی كـە فێـری زمانەكـەی دەبیـت. زمـانی ئینگلیـزی زمـانێكی نێـو دەوڵەتییـە كـە لـە چـەندین وولات و چـەندین زانكـۆو كۆمپانیا و ڕێكخراوە نێو دەوڵەتییەكان لە بوارە جیاوازەكانـدا گرنگـی زیاتری پێدەدرێت.مرۆڤ هەمیشە لە پرۆسەی فێربووندایە،چەند فێـربین و چەند بـزانین ئـەوە بۆمـان دەردەكـەوێت كـە زانسـت و زانیـاری وەك دەریا قوڵـەو نـاتوانین بەتـەواوی هـەمووی فێربین،بـەڵام دەتـوانین زۆر شتی بەسوود فێربین كە خزمەت بە خۆمان و دەوروبەری پێ بكەین.

لەم كتێبەدا بە چەند بەشێك فێربـوونی زمـانی ئینگلیـزیم خسـتۆتە ڕوو بـۆ ئـەو فێرخوازانـەی كـە ئاسـتی زمانەكـەیان سـەرەتایی و مامناوەندە،هـەروەها فێرخـوازانی ئاسـتی پێشـەكەوتووش دەتـوانن سوود لەم كتێبـە وەربگـرن چـونكە بـە شـێوازێك ڕێكمخسـتون كـە لـە ئاسـتی سـەرەتاوە تـا ئاسـتی پێشـكەوتوو دەتـوانن سـوودی لێوەربگرن،بۆ نمونە بابەتـە( ڕێزمانییـەكان و ووشـە ئەكادیمییـەكان و دەنگـەكان و وولاتـان و نەتـەوەكان ) هـەموو ئەمانـە بنچـینەیین و

دەکرێت فێرخوازانی ئاستی سەرەتا تاکو ئاستی پێشکەتوو سوودی لێوەربگرن لە زمانی قسەکردن و نوسیندا.هەروەها بەشی ووشەو دەستەواژە باوەکانیش کە لەم کتێبە هەیە بەرێژەیەکی زۆر لە ئاستی سەرەتاو مامناوەند و پێشکەوتوو بەکاردێن.

ئەم کتێبە لە شەش بەش پێکهاتووە،بەشەکانیش ئەمانەن: بەشی یەکەم ، دەنگە، یارمەتیت دەدات لە فێربوون و چۆنێتی دەربڕینی ووشەکان بە دەنگێکی دروست لەسەر شێوازی بریتانی. بەشی دووەم رێزمانە، یارمەتیت دەدات لە دروستکردنی ڕستە لەکاتی قسەکردن و نوسیندا بەشێوازێك کە گوێگر خۆشحاڵتر دەبێت ئەگەر قسەکردنەکەت جوان بێت و هەڵەی رێزمانی نەکەیت.. بەشی سێهەم ووشە و دەربڕینە باوەکانی ڕۆژانەیە ، یارمەتیت دەدات فێری قسەکردنی ڕۆژانە بیت لەسەر بوارە جیاوازەکان بە ووشەو دەستەواژەی بەکارهاتووی ڕۆژانەوە.بەشی چوارەم پەندو وتە باوەکانە کە هەندێکی پەندی کوردی بەرامبەر نوسراوەو هەندێکی تەرجەمەی وشەیی بۆ کراوە بەڕونکردنەوەی زیاتر.بەشی پێنجەم ووشە ئەکادیمییەکانە بۆ هەموو ئاستەکان گرنگە کە لە هەموو بوارەکان بەکاردێت چ ئەدەبی بن یان زانستی بەتایبەتی لە تاقیکردنەوەی تۆفڵ و تاقیکردنەوە نێودەوڵەتییەکانی تری زمانی ئینگلیزی. بەشی شەشەم سەبارەت بە ناوی ووڵاتان و نەتەوەکانە کە لە زمانی نوسین و قسەکردن زۆر بەکاردێن بەتایبەتی لە ڕاگەیاندندا.لە کۆتاییدا ئەوەی ماوە بیڵێم ئەوەیە هیوام وایە توانیبێتم خزمەتێکی باشی فێرخوازانی زمانی ئینگلیزیم کردبێت، بێگومان لە نوسین و دانان و وەرگێڕانی کتێب هەڵە

دەكرێت،بۆیە بۆ هەر پرسیار و پێشنیارێك سەبارەت بەم كتێبە دەتوانن پەیوەندیم پێوە بكەن بەهیوای سەركەوتن بۆ هەموو لایەك.

**خالد غفار نامق**

**کەلار**

2013/3/20

**ژ.مۆبایل:** 07703554643

khalid.namiq@yahoo.com

# بەشەکانی ئەم کتێبە

# بەشی یەکەم
# English Sounds
# دەنگەکانی زمانی ئینگلیزی

لەم بەشەدا سەرەتا پیتەکانی زمانی ئینگلیزی بزانە پاشان هێما دەنگییەکان و چەند تێبینی و ئاسانکارییەك هەن سەبارەت بە دەنگ و فێربوونی شێوازی خوێندنەوەی ووشەی ئینگلیزی. ئەم تێبینیانەی خوارەوە سوودێکی زۆریان هەیە بۆ شارەزابوونت لە دەنگی زمانی ئینگلیزی چونکە پێویستت پێی دەبێت بۆ ئەو وشەو دەستەواژانەی لەم کتێبەو دەرەوەی ئەم کتێبەش دێتە پێشت. بەڵام لەم کتێبەدا وشەو دەستەواژەکان بە کوردی دەنگەکەی نوسراوە بۆ ئاسانکردنی خوێندنەوەیان بۆ فێرخوازان.

## پیتەکانی زمانی ئینگلیزی

| A a | ئەی | N n | ئێن |
|---|---|---|---|
| B b | بی | O o | ۆ |
| C c | سی | P p | پی |
| D d | دی | Q q | کیو |
| E e | ئی | R r | ئاڕ |
| F f | ئێف | S s | ئێس |
| G g | جی | T t | تی |
| H h | ئەیچ | U u | یو |

| I I | ئای | V v | ڤی |
|---|---|---|---|
| J j | جەی | W w | دەبلیو |
| K k | کەی | X x | ئێکس |
| L l | ئێڵ | Y y | وای |
| M m | ئێم | Z z | زەد |

## ئەم خشتەیەی خوارەوەش دەنگەکانی زمانی ئینگلیزییە :

### Sounds of English

**VOWELS**

| ی | و | ئە | ۆ | ئە/ە | ێ | ئا | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ɪ | ʊ | ʌ | ɒ | ə | e | æ | 'short' کورت |

| iː یی | uː وو | ɑː ئا | ɔː ۆ | ɜː یێ | 'long' درێژ |
|---|---|---|---|---|---|

| ییە | وە | ئای/ای | ۆی/ئۆی | ەو/ئەو | ێیە | ئاو | ئەی/ەی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ɪə | ʊə | aɪ | ɔɪ | əʊ | eə | aʊ | eɪ | diphthongs جوت بزوێن |

**CONSONANTS**

| پ | ت | چ | ك | ف | ث | س | ش | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| p | t | tʃ | k | f | θ | s | ʃ | voiceless بێ لەرە |
| ب | د | ج | گ | ڤ | ذ | ز | ژ | |
| b | d | dʒ | g | v | ð | z | ʒ | voiced لەرەدار |
| م | ن | نگ/سینگە | هـ | ل/ڵ | ر/ڕ | و | ی | |
| m | n | ŋ | h | l | r | w | j | |

bbclearningenglish.com

**لە زمانی ئینگلیزی ( 44 ) هێمای دەنگی هەیە کە 24 یان نەبزوێنەو ( 20 ) یان بزوێنە.**

**نەبزوێنەکانیش دوو جۆرن : بێ لەرەو لەرەدار. بزوێنەکانیش دوو جۆرن : تاك بزوێنەکان و جوت بزوێنەکان.**

**نەبزوێنە بێ لەرەکان ئەمانەن :** ( p, t, ʧ, k, f, Θ, s, ʃ )

**نەبزوێنە لەرەدارەکان ئەمانەن :** ( b,d,ʤ,g,v,ð,z,ʒ,m,n,ŋ,h,l,r,w,j )

**تاك بزوێنەکان ئەمانەن کە کورت و درێژن :** ( e, a, i:, u:, a:, o:, 3:,ə,ɪ, ʊ , ʌ, o )

**جوت بزوێنەکان ئەمانەن :** ( ɪə, ʊə, aɪ, oɪ, əʊ, eə, au, eɪ )

# Some important notes about English sounds

# هەندێ تێبینی گرنگ دەربارەی دەنگەکانی زمانی ئینگلیزی

1 ) **پیتی** ( p ) **ناخوێنرێتەوە لە** ( ps- ) **و** ( pn- ) **وەك ئەم ووشانەی خوارەوە :**

Psychology / pneumonia

2 ) **پیتی** ( t ) **بێدەنگەو ناخوێنرێتەوە لە** ( tch ) **و بە دەنگی /ʧ / چ/ دەخوێنرێتەوە :**

Catch → /kæʧ/

Match → / mæʧ/

3 ) پیتی ( t ) ناخوێنرێتەوە لە ( stle ) و ( sten ) وەك:

Castle → /kæsl/

Listen → /lisn/

4 ) پیتی ( k ) ناخوێنرێتەوە لە ( kn ) لەسەرەتای وشە وەك:

Know →/nəʊ/

Knight →/nait/

5 ) ( ph ) لەم ووشەیە بە /v/ یان /f/ دەخوێنرێتەوە:

Nephew→ /nefju: / or / nevj u: /

6 ) پیتی ( b ) لە کۆتایی ووشە هات لە دوای پیتی ( m ) ئەوە پیتی ( b ) بێدەنگە و ناخوێنرێتەوە:

Comb → /kəʊm/
Climb →/ klaim/

بەڵام ئەگەر ( mb ) لە کۆتایی نەهات ئەوە پیتی ( b ) دەخوێنرێتەوە وەك:

Number / Member

7 ) پیتی ( a ) زۆرجار بە /a:/ واتە ( ئا- درێژ ) دەخوێنرێتەوە ئەگەر لە پێش ( r /l ) هات:

Car →/ k a:/
Are→/ a:/
Half→/h a:f/

8) **پیتی** ( o ) **زۆرجار بە** /o:/ **واتە ( ۆ – درێژ ) دەخوێنرێتەوە ئەگەر لە پێش** ( r ) **هات:**

For →/f o:/

Short →/ʃ o:t/

9) **زۆرجار** ( er – or – re ) **بە دەنگی** /ə/ **دەخوێنرێنەوە ئەگەر لە کۆتایی ووشەوە هاتن:**

Cent<u>**re**</u>

Teach<u>**er**</u>

Doct<u>**or**</u>

10) **زۆربەی جار** ( th ) **بە دەنگی** /θ/ **واتە ( ث ) دەخوێنرێتەوە ئەگەر پیتی** ( e ) **لەدوایەوە نەهات:**

Think → / θɪŋk/

Throw →/θrəʊ/

**بەڵام لەم ووشانە هەرچەندە پیتی** ( e ) **نەهاتووە** ( th ) **بە دەنگی** /ð/ **واتە ( ذ ) دەخوێنرێتەوە:**

(**th**an, **th**is, **th**at, **th**ose, wi**th**, **th**us, smoo**th**, **th**ough, al**th**ough, soo**th**ing)

11 ) پیتی ( th ) بە دەنگی /ð/ دەخوێنرێتەوە ئەگەر پیتی ( e ) لە دوایەوە هات:

The → /ðə/

These → / ði:z/

There → / ðeə/

12 ) لەم ووشانەدا ( th ) بە دەنگی /θ/ دەخوێنرێتەوە هەرچەندە لە دوایانەوە پیتی ( e ) هاتووە.

(ma**the**matics, **the**rmometer, **the**ft, **the**rapy, **the**me, an**the**m, **the**ory, **the**ology, **the**atre)

13 ) پیتی ( h ) لە زۆر ووشەدا ناخوێنرێتەوە وەك:

(where, what, why, when, which, honest, whether, heir, wheel, white, hour, honor, shepherd, school, oh, philosophy, ghost, ..........)

# Pronunciation of (-ed) endings

# دەربڕینی دەنگی پاشگری ( ed )

/-ed/ کۆتایی سێ شێوازی هەیە:

1 ) /-ed/ بە دەنگی /t/ دەخوێنرێتەوە ئەگەر فرمانەکە بە یەکێك لەم دەنگە نەبزوێنە بێ لەرانە کۆتایی هاتبێت ( /p / ʃ / k / f / s / ʧ ) بۆ نمونە:

Loo**k** + ed → look**ed**

Sto**p** + ed → stopp**ed**

Mis**s** + ed → miss**ed**

Wa**tch** + ed → watch**ed**

Fini**sh** + ed → finish**ed**

Lau**gh** + ed → laugh**ed**

**2) (-ed) کۆتـایی بە دەنگی /id/ دەخوێنرێتەوە ئەگەر ووشەکە بـە /t/ یــان /d/ کۆتـایی هاتبێت:**

Inven**t** + ed → invent**ed**

Nee**d** + ed →need**ed**

**3) (-ed) کۆتـایی بە دەنگی /d/ دەخوێنرێتەوە ئەگەر ووشەکە بە یەکێك لەو دەنگانە کۆتـایی نەهاتبێت کە لە خـاڵی (1 و 2) هەن،واتــە ئەگــەر بــە یــەکێك لەمانە کۆتـایی هاتبێت /m ,r , z , g , b , n, v, l, ð, ʤ/ :**

Smell + ed → smelled

Save + ed → saved

Clean + ed → cleaned

Rob + ed → robbed

Change + ed → changed

# Pronunciation of final – s :

## دەربڕینی دەنگی پاشگری ( s )

1 ) پاشگری ( -s ) بە دەنگی /s/ دەخوێنرێتەوە ئەگەر ووشەکە بە یەکێك لەم دەنگانە کۆتایی هاتبێت

**/p/ t / k / f / Θ /**

Seat + s → seats

Stop + s → stops

Lack + s → lacks

Laugh + s → laughs

Bath + s → baths

2 ) پاشگری ( -s ) بە دەنگی /z/ دەخوێنرێتەوە ئەگەر ووشەکە بە یەکێك لەم دەنگانە کۆتایی هاتبێت:

**/ b/d/r/g/v/l/n/m/ð/**

Seed + s → seeds

Rob + s → robs

Bag + s → bags

See + s → sees

**3 ) پاشگری ( -s ) بە دەنگی /iz/ دەخوێنرێتەوە ئەگەر ووشەکە بە یەکێك لـەم دەنگانە کۆتـایی هاتبێت:**

**/s/z/ʃ/ʤ/ʒ/ʧ/**

dish + es → dishes

prize + s → prizes

kiss + es→ kisses

edge + s → edges

catch + es → catches

# بەشی دووەم

# Grammar ڕێزمان

لە بەشی ڕێزماندا تەنها چەند بابەتێکی ڕێزمانیم بە کورتی باسکردووە، تاکو فێرخواز تووشی شڵەژاوی نەبێت لە فێربوونی زمانەکەدا، چونکە تەنها بە پراکتیکی دەتوانیت ڕێزمانێکی باش فێر بیت لە قسەکردن و نوسیندا، بەڵام ئەوەی گرنگ و پێویست بێت لە ڕێزمانی ئینگلیزی بۆ گفتوگۆی ڕۆژانە ئەوە لەم بەشەدا بە کورتی باسمکردوون بەتایبەتی فێربوون و بەکارهێنانی دەمەکانی فرمان کە زۆر گرنگن.هەروەها ئەگەر فێرخواز ئارەزووی زیاتری هەیە لە فێربوونی ڕێزمانی ئینگلیزی و دەیەوێت زۆرترین زانیاری دەست بکەوێت لەسەر بابەتە ڕێزمانییەکان ئەوە کتێبی تایبەت بە ڕێزمان هەیە بۆ هەموو ئاستەکان کە دەتوانێت سوودیان لێوەربگرێت کە تەنها بە زانینی واتای نزیکەی ( 1000 ) ووشە دەتوانێت بە ئاسانی بیا نخوێنێتەوەو تێیان بگات.

## Personal Pronouns: ڕاناوە کەسییەکان

| Subject pronoun | Object pronoun | Possessive adjectives | Possessive pronouns | Reflexive pronouns |
|---|---|---|---|---|
| راناوی بکەر | راناوی بەرکار | ئاوەڵناوی خاوەنداریتی | راناوی خاوەنداریتی | راناوی خۆیی |
| I من | me من | my هی من | هی منە mine | خۆم myself |

| ئەو (کوڕ) he | ئەو him | هی ئەو his | هی ئەوە his | خۆی himself |
|---|---|---|---|---|
| She ئەو (کچ) | ئەو her | هی ئەو her | هی ئەوە hers | خۆی herslef |
| ئەو It (بێگیان) | it ئەو | هی ئەو شتە its | هی ئەوە its | خۆی itself |
| you تۆ | تۆ you | هی تۆ your | هی تۆیە yours | خۆت yourself |
| ئێوە you | ئێوە you | هی ئێوە your | هی ئێوەیە yours | خۆتان yourselves |
| ئێمە we | ئێمە us | هی ئێمە our | هی ئێمەیە ours | خۆمان ourselves |
| ئەوان they | ئەوان them | هی ئەوان their | هی ئەوانە theirs | خۆیان themselves |

**نموونە :**

1. I study English. من ئینگلیزی دەخوێنم.
2. Listen to me. گوێم لێبگرە.
3. My name is Ali. ناوم علی یە.
4. That mobile is mine. ئەو مۆبایلە هی منە.
5. I introduced myself to him. من خۆم ناساند بەو کوڕە.

************************************

1. They work hard. ئەوان بە سەختی ئیش دەکەن.

2. I helped them last night. دوێنێ شەو یارمەتی ئەوانم دا.

3.Their house is nicer than our house / ours. خانووەکەیان جوانترە لە خانووەکەمان.

4. That car is theirs. ئەو سەیارە هی ئەوانە.

5. They showed themselves as the house's owner. ئەوان خۆیان بە خاوەنی خانوەکە دەرخست.

# Verb Tenses

# دەمەکانی فرمان

دەمەکانی فرمان گرنگترین و باشترین ڕێگایەکە کە یارمەتیت دەدات بەئاسانی ڕستە دروست بکەیت لە زمانی ئینگلیزی بە پێی کات و بارودۆخە تایبەتەکان. لە خوارەوە بە کورتی دەمەکانی فرمان ڕوونکراوەتەوە بە یاساو نمونەوە کە دەتوانی سوودیان لێوەربگریت؛

## *1) Present Simple* *ڕانەبردووی سادە*

بەکاردێت بۆ ئەو کات و ڕووداوانەی کە هەمیشەیین یان زۆر جار دوبارە دەبنەوە. وەك سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆر... هەستان لە خەو و نان خواردن و ڕۆشتن بۆ ئیش.

**Positive :** ئەرێنی

| **(He/she/it) + verb.s (v.s) + complement** |
|---|

He likes black color. ئەو کوڕە حەزی لە ڕەنگی ڕەشە.

She gets up at 7 am every day. ئەو کچە هەموو ڕۆژێك لە کاتژمێر حەوتی بەیانیان لەخەو هەڵدەستێت.

| (We/you/I/they) + verb + complement |
|---|

e.g: We study ESOL. ئێمە وانەی ئیسوڵ دەخوێنین.

e.g: I go to work at 8:00 am until 2:00 pm.

دەڕۆم بۆ ئیش لە سەعات هەشتی بەیانی تاکو دووی پاش نیوەڕۆ.

**Negative** نەرێنی

| (I / they / we/you) + don't + base + complement |
|---|
| He/she/it + doesn't + base + complement |

تێبینی: (base) واتە چاوگ.

I don't drink coffee. من قاوە ناخۆمەوە.

It doesn't snow in Kalar. لە کەلار بەفر نابارێت.

بەزۆری یەکێك لەم ئاوەڵکارانە دێت لە ڕستەکەدا :

| every day | هەموو ڕۆژێك | usually | زۆرجار |
|---|---|---|---|
| every week | هەموو هەفتەیەك | Often | بەزۆری |
| every year | هەموو ساڵێك | sometimes | هەندێجار |
| every + time | هەموو + کات | rarely | بەدەگمەن |
| Always | هەمیشە | never | هەرگیز |

نموونە :

I usually get up at 7.  زۆرجار لە کاتژمێر حەوتی بەیانی لەخەو هەڵدەستم.

Question  پرسیاری

**(Wh-question words)  does + he/she/it + base .....?**

**(wh-question words) do + they/we/you/I + base....?**

e.g: Do you eat apple?  Yes I do  No, I don't

Does he eat apple? Yes, he does  No, he doesn't

e.g: What do you do at night?  شەوان چی دەکەیت؟

e.g: Doesn't she study English?  ئایا ئەو کچە ئینگلیزی ناخوێنێت؟

e.g: Why don't they study with us?  ئەوان بۆچی لەگەڵ ئێمە ناخوێنن؟

لەکاتی نەرێنی بۆ پرسیاری دەبێت ( not ) بۆ ( do, does ) زیـاد بکـەین و هەنـدێ جـار لەسەرەتـای رستەکەوە ووشەی پرس دێت و هەندێ جار نایەت.

| Question words | ووشەی پرس |
|---|---|
| What | چ – چی |
| When | کەی |
| Where | لەکوێ- کوێ |
| Why | بۆچی |
| Which | کام – کامە |
| Who | کێ |
| How | چۆن – چەند |

## *2) Present Continuous* *ڕانەبردووی بەردەوام*

بەکاردێت بۆ ئـەو کـات و ڕووداوانـەی کـە لـەکاتی ئێسـتادا بـە بـەردەوامی ڕوو دەدەن و کاتین.واتە پێچەوانەی ڕانەبردووی سادەیە.

Positive : ئەرێنی

| **He/she/it + is** | **+ verb ing ........** |
|---|---|
| **They/we/you + are** | **+ verb ing ........** |
| **I + am** | **+ verb ing.......** |

Negative: نەرێنی

تەنها ( not ) دەنوسین یان زیاد دەکەین لە دوای ( is/am/are ).

Question : پرسیاری

| Is + he/she/it + verb ing....? |
| --- |
| Am + I + verb ing...? |
| Are + they/we/you + verb ing....? |

هەندێ جار لەسەرەتای ڕستەی پرسیاری ووشەی پرس دێت بە پێی حاڵەتەکەو هەندێجاریش ڕستەکە نەرێیە. هەروەها لەرستەی رانەبردوی بەردەوام زۆرجار ئەم ووشانە دێن کە واتای ( ئێستا یان هەر ئێستا ) دەگەیەنن:

(Now / right now / at the moment)

Examples:

- He is studying ESOL now. ئەو کوڕە وا ئێستا وانەی ئیسۆڵ دەخوێنێت.

- It is not raining. ئێستا وا باران نابارێت.

- I am watching TV. ئێستا تەماشای تەلەفزیۆن دەکەم.

- We are cleaning the room. ئێستا وا ژوورەکە پاك دەکەینەوە.

- I'm not speaking to you. وا لەگەڵ تۆ قسە ناکەم.

- Are they listening to us? وا گوێمان لێدەگرن؟

- What are you reading at the moment? ئێستا چی دەخوێنیتەوە؟

- Who is washing the car ? کێ ئۆتۆمبیلەکە دەشوات ؟

ت : ڕانەبردووی سادە بۆ ئەو کارانەیە کە هەمیشەیین یان زۆر جار ڕوو دەدەن و دووبارە دەبنەوە، بەڵام ڕانەبردووی بەردەوام بۆ کارێکە کە کاتییە واتە لەکاتی ئێستا ڕوو دەدەن بە بەردەوامی. وە ئەم دوو دەمی فرمانە زۆرترین جار بەکاردێن لە ژیانی ڕۆژانەدا بۆیە دەبێت بە کرداری بیخوێنیت.

## 3) *Past Simple* ڕابردووی سادە

| I / he/she/it/they/we/you + verb -ed + complement. |
|---|

| Subject + didn't + base + ……. نەرێ |
|---|

| Did + subject + base …… ? پرسیاری |
|---|

ت : هەندێ جار ووشەی پرس دێت لە سەرەتای ڕستەی پرسیاری و هەندێجاریش بە نەرێ پرسیار دەکەین.

ت : دەکرێت یەکێك لەم ئاوەڵکارە کاتیانە بێت لە ڕستەکە :

| Last night / last week/ last year | شەوی ڕابردوو/هەفتەی ڕابردوو/ پار ساڵ |
|---|---|
| ago | لەمەوپێش |
| Yesterday | دوێنێ |

ت : هەندێجار فرمانی نارێك لە ڕستەکە دێت کە لەم بەشەدا باسکراون وەك:

Go → went

Examples:

- We helped the man. یارمەتی پیاوەکەمان دا.

- I went to market to buy something. چووم بۆ بازاڕ هەندێ شت بکڕم.

- I didn't go to work yesterday. دوێنێ نەڕۆشتم بۆ ئیش.

- She didn't study ESOL last Thursday. پێنج شەممەی ڕابردوو ئەو کچە وانەی ئیسۆلی نەخوێند.

- Did you stay at home last night? دوێنێ شەو لە ماڵ مایتەوە؟

Yes, I did No, I didn't

- Where did they go yesterday morning? ئەوان دوێنێ بەیانی بۆ کوێ ڕۆشتن؟

- Why didn't he work ? ئەو بۆچی ئیشی نەکرد؟

## *4) Past Continuous ڕابردووی بەردەوام*

بەکاردێت بو کارێك کە لە ڕابردوو کردوومانە بە بەردەوامی و کاتی بووە.

**(I / he/ she/ it) + was + verb ing ……**

**(We / they / you) + were + verb ing ….**

e.g: - They were walking in the park. ئەوان پیاسەیان دەکرد لەناو پارکەکە.

e.g: She was washing the dishes. کچەکە قاپەکانی دەشۆرد.

ت: بۆ نەریٚ تەنها ( not ) دادەنێین لە دوای ( was, were ).

e.g: She wasn't washing the dishes. ئەو کچە قاپەکانی نەدەشۆرد.

Question:

**Was + ( I /he/she/it) + verb ing.....?**

**Were + ( they/ you/ we) + verb ing ....?**

لەکاتی پرسیاری دەکرێت ووشەی پرس بێت لەسەرەتاوە و دەکرێت نەریٚ بێت رستەکە .

Examples:

- What was she doing ? ئەو کچە چی دەکرد؟
- Who were you talking to ? لەگەڵ کیٚ قسەت دەکرد؟

## 5)Present perfect ( مەبەست لێی ڕابردووی تەواوە ) ڕانەبردوی تەواو

**تێبینی: ( لە ڕێزمانی کوردی ناونیشانێك بەناوی ڕانەبردووی تەواو نیە )**

ت/ ئەم دەمە بەکاردێت بۆ کارێك یان رووداوێك لە رابردوو دەستی پێکردووە و لە ئێستادا تەواو دەبێت یان تەواو بوومو کاریگەری لەسەر ئێستا هەیە.

| He/she/it + has + p.p…. |
|---|
| We/you/they/ I + have + p.p… |

تێبینی: ( P.P ) واتە ( past participle ) کە لەم بابەتەو هەندێکی تر بەکاردێت.

**ت/ بۆ نەرێ تەنها ( not ) لە دوای ( have/has ) دادەنێین و لە پرسیاریش ( have/has ) لە جێگەی بکەر دادەنێین و بکەر لە جێگەی ( have/has ) دەنوسین.**

- Kalar has remained Kurdistan's biggest town. **کەلار بە گەورەترین شارۆچکەی کوردستان ماوەتەوە.**

- She has not bought her brother a nice blouse. **ئەو کچە بلوزێکی جوانی نەکڕیوە بۆ براکەی.**

- Have you got the book? **کتێبەکەت دەستکەوتوە؟**

**ت/ ئەگەر کاتی دەست پێکردنی کارەکە باس بکەین ئەوە ( since ): لەوەتی بەکاردێنین. بەڵام ئەگەر ماوەی ڕوودانی کارەکە بژمێرین ئەوە ( for ) بەکاردێت.**

e.g: I haven't eaten anything since 8:00 am. **لەوەتی کاتژمێر هەشتی بەیانیەوە هیچم نەخواردوە.**

e.g: I haven't eaten anything for eight hours. **بۆ ماوەی هەشت کاتژمێرە هیچم نەخواردوە.**

**ت: ئەم وشانە بەکاردێت بۆ پیشاندانی پەیوەندی نێوان ڕابردوو و ئێستا لەگەڵ ڕانەبردووی تەواودا.**

| | |
|---|---|
| already | **پێشتر** |
| just | **کەمێك پێش**<br>**ئێستا/تەنها** |
| now | **ئێستا** |
| yet | **هێشتا** |
| never | **هەرگیز ( ئەرێنی )** |
| ever | **هەرگیز( ئەرێنی )** |

ت/ ( never ) واتە ( هەرگیز ) لە رستەی نەرێ بەکاردێت کە لە مانادا نەرێیە و لە دوای ( have/has ) دەنوسرێت.

ت/ ( ever ) واتە ( هەرگیز ) لە رستەی پرسیاری بەکاردێت یان لە نەرێ.

ت/ ( already,now,just ) لە دوای ( have/has ) دێن.

ت/( yet ) لە کۆتایی رستەی نەرێ یان پرسیاری دێت.

| | |
|---|---|
| -I have never visited London. | هەرگیز سەردانی لەندەنم نەکردووە. |
| - Have you ever been to London? | ئایا هەرگیز ڕۆشتوی بۆ لەندەن؟ |
| - She has already eaten lunch. | ئەو کچە پێشتر نانی نیوەڕۆی خواردوە. |
| e.g: He hasn't finished the job yet. | ئەو کوڕە هێشتا کارەکەی تەواو نەکردوە. |

## 6) Past perfect ڕابردووی دوور

ت/ بەکاردێت بۆ روداوێك یان کارێك کە بە ڕێکوپێکی و یەك لەدوای یەك لە رابردوودا رویداوەو تەواو بووە.

| Subject+ had + p.p…… |
|---|

ت/ بۆ نەرێ تەنها ( not ) لە دوای ( had ) دەنوسین و لە پرسیاریش ( had ) و ( بکەر ) ئاڵوگۆر دەکەین.

ت/ هەندێ جار ( by ) لەگەڵ رابردووی تەواو دێت بە واتای ( لەوکاتە ) و هەروەها( until )یش بەکاردێت بەواتای ( تاکو ).

- I had had my lunch. نانی نیوەڕۆم خواردبوو.

- She had completed her job. ئیشەکەی تەواو کردبوو.

- They had not finished the job. ئیشەکەی تەواو نەکردبوو.

- Had you been to Iran? لە ئێران بوویت؟

e.g: Until Europeans started arriving America's population had remained small.

دانیشتوانی ئەمریکا بە کەمی مابوو تاکو ئەوروپییەکان دەستیانکرد بە گەیشتن بۆ ئەمریکا.

e.g: By 1900, NY's population had passed one million.

لەساڵی 1900 دانیشتوانی نیۆرك یەك ملیۆنی تێپەڕاند بوو.

e.g: When they came to the office, we had already left.

کاتێك ئەوان هاتن بۆ نوسینگەکە، ئێمە پێشتر ڕۆشتبووین.

# 7) Present perfect continuous

# ڕانەبردوی تەواوی بەردەوام

ت/ بەکارێت بۆ ئەو کارو ڕووداوانەی کە لە رابردوودا دەستی پێکردووەو ئێستاش بەردەوامەو تەواو نەبووە.

He/she/it + has been+ verb ing…..

They/we/you/ I + have been + verb ing …..

ت/ بۆ نەرێ تەنها ( not ) دەنوسین لە دوای ( have/has ) و بۆ پرسیاریش ( have/has ) و ( بکەر ) ئاڵوگۆڕ دەکەین.

- We have been waiting for the result of the exam. وا لە چاوەڕوانی داین بۆ ئەنجامی تاقیکردنەوەکە.

- She has not been arriving at home. ئەو هێشتا نەگەیشتۆتەوە ماڵ.

## 8) Past Perfect Continuous

## ڕابردوی دووری بەردەوام

ت: ئەم دەمەی فرمان ماوەی کارێك یان ڕووداوێك دەردەبڕێت کە بەردەوام بووە لە پێش کارێکی تر لە ڕابردوودا.

| Subject + had been + verb ing + complement |
|---|

e.g: The police had been looking for the criminal for two years.

پۆلیسەکان ماوەی دوو ساڵ لە گەڕاندابوون بۆ دۆزینەوەی تاوانبارەکە.

# 9) Simple Future داهاتووی سادە

ت: داهاتووی سادە بەم شێوانە دەردەبڕێت:

1) ئەگەر لەکاتی قسەکردندا دڵنیا بووی کارەکە لە داهاتوو ڕوو دەدات و ڕاستە ئەوە دەتوانین بڵێین:

| Subject + will + base + complement |
|---|

Or

| Subject + is/am/are + going to + base + complement |
|---|

e.g: According to the weather report, it will be cloudy tomorrow.

بە پێی ڕا پۆرتی کەشناسی، سبەی ئاوهەواکەی هەوراوی دەبێ.

e.g: According to the weather report, it is going to be cloudy tomorrow. بە پێی ڕا پۆرتی کەشناسی، سبەی ئاوهەواکەی هەوراوی دەبێت.

ت: لەکاتی نەرێنی تەنها (not) لە دوای فرمانی یاریدەدەر دادەنێین و لەکاتی پرسیاریش فرمانی یاریدەدەر و بکەر ئاڵوگۆڕ دەکەین:

e.g: According to the weather report, it won't be cloudy tomorrow.

e.g: According to the weather report, it isn't going to be cloudy tomorrow.

e.g: Will it be cloudy tomorrow? ئایا سبەی ئاو هەوا هەوراوییە ؟

e.g: Is it going to be cloudy tomorrow? ئایا سبەی ئاو هەوا هەوراوییە ؟

2 ) ئەگەر قسەکەر پێشتر پلانی بۆ کارەکە دانابێت کە ئەنجامی بدات لە داهاتوو ئەوە دەبێت یاسای ( be going to ) بەکاربهێنین و نابێت ( will ) بەکاربهێنین:

e.g: A: Why did you buy this paint?

B: I **am going to** paint my living room tomorrow.

واتە: أ : بۆچی ئەم سبوخەت کڕیوە؟

ب: سبەی ژووری میوانەکەم سبوخ دەکەم.

# 10) Future continuous

## داهاتووی بەردەوام

ت/ ئەم زەمەنە بەکاردێت بۆ کارێك لە کاتێك لە داهاتوودا بە بەردەوامی ڕوو دەدات، هەروەك ڕانەبردووی بەردەوام و ڕانەبردووی تەواوی بەردەوام کارەکە بەردەوامە لە ڕووداندا بەڵام لێرە لە داهاتوو دەبێت.

Positive: subjest + will be + v.ing…..

Negative: subjest + won't be + v.ing….

Question : will /won't + subjest + be + v.ing….?

ت/ هەندێ جار لە پرسیاری ووشەی پرس لەسەرەتاوە دێت .

- I will be teaching you English. دوایێ وانەی ئینگلیزیت پێدەڵێم لەم کاتە ( لەداهاتوو ).

- She won't be coming to class. ئیتر ئەو کچە نایەت بۆ وانە لەم کاتە ( لە داهاتوو ).

- When will you be doing your homework? کەی ئەرکیماڵەوەت دەکەیت؟

## 11) Future Perfect

## داهاتووی تەواو

ت: داهاتووی تەواو باس لە کارێك یان حاڵەتێك دەکات کە لە پێش کارێك یان ڕووداوێکی تر تەواو دەبێت لە داهاتوودا.

| Subject + will have + p.p + complement |
|---|

e.g: I will have finished my homework by the time I go out for a walk tonight.

ئەرکی ماڵەوەم تەواو دەکەم لەوکاتەی ئەمشەو دەڕۆمە دەرەوە بۆ پیاسەکردن .

# 12) Future Perfect Continuous

## داهاتووی تەواوی بەردەوام

ت : داهاتووی تەواوی بەردەوام جەخت دەکاتەوە سەر ماوەی چالاکییەك یان رووداوێك کە بەردەوام دەبێت لە ڕوودانیدا لە پێش کارێك یان ڕووداوێکی تر لە داهاتوودا. هەروەها هەندێ جار ئەم دەمی فرمانە وەکو داهاتووی تەواوە و یەك مانایان دەبێت.

| Subject + will have been + v.ing + complement |
|---|

e.g: When our teacher retires next month, he will have been teaching for 45 years.

واتە : کاتێك مامۆستاکەمان مانگی داهاتوو خانەنشین دەبێت، ئەوە بۆ ماوەی 45 ساڵ وانەی پێشکەش کردووە.

## Irregular Verbs

### فرمانە ریزپەڕەکان / نارێکەکان

| simple form چاوگ/ سادە | past simple رابردووی سادە | past participle (p.p) | Meaning |
|---|---|---|---|
| be | was/were | been | دەبێت بە |
| beat | beat | beaten | لێدەدات |
| become | became | become | دەبێت بە |

| begin | began | begun | دەست پێدەکات |
|---|---|---|---|
| bend | bent | bent | دەچەمێتەوە |
| bite | bit | bitten | قەپ دەگرێت/ گاز دەگرێت |
| blow | blew | blown | فوو پیادەکات/ هەوای تێدەکات |
| break | broke | broken | دەشکێنێت |
| bring | brought | brought | دەهێنێت |
| broadcas t | broadcast | broadcast | پەخش دەکات (رادیۆ و تەلفزیۆن |
| build | built | built | بنیات دەنێت |
| buy | bought | bought | دەکرێت |
| catch | caught | caught | دەگرێت |
| choose | chose | chosen | هەڵدەبژێرێت |
| come | came | come | دێت / هاتن |
| cost | cost | cost | تێچوونی نرخ/ بەهای ئەوەندەیە |
| cut | cut | cut | دەبڕێت |
| dig | dug | dug | هەڵدەکەنێت (چاڵ) |

| do | did | done | ئه نجام دەدات |
|---|---|---|---|
| draw | drew | drawn | دەکێشێت ( وێنە و هێڵکاری ) |
| dream | dreamt | dreamt | خەون دەبینێت |
| drink | drank | drunk | دەخواتەوە |
| drive | drove | driven | لێدەخوڕێت |
| eat | ate | eaten | دەخوات |
| fall | fell | fallen | دەکەوێت ( لەڕووی جەستەیی ) |
| feed | fed | fed | خواردنی پێدەدات |
| feel | felt | felt | هەست دەکات |
| fight | fought | fought | شەڕ دەکات |
| find | found | found | دەدۆزێتەوە |
| fly | flew | flown | دەفڕێت |
| forecast | forecast | forecast | پێشبینی دەکات |
| forget | forgot | forgotten | لەبیر دەکات |
| forgive | forgave | forgiven | دەیبورێت |
| freeze | froze | frozen | دەیبەستێت ( ساردی ) |

| get | got | got | بەدەستی دێنێت |
| --- | --- | --- | --- |
| give | gave | given | دەبەخشێت |
| go | went | gone | دەڕوات |
| grow | grew | grown | گەشە دەکات |
| hang | hung | hung | هەڵدەواسێت |
| have | had | had | هەیەتی/ هەبوون |
| hear | heard | heard | دەبیستێت |
| hide | hid | hidden | دەشارێتەوە |
| hit | hit | hit | لێدەدات |
| hold | held | held | ئەنجام دەدات/ گرتن |
| hurt | hurt | hurt | ئازاری دەدات |
| keep | kept | kept | دەپارێزێت |
| know | knew | known | دەزانێت / دەناسێت |
| lead | led | led | ڕابەری دەکات |
| learn | learnt | learnt | فێر دەبێت |
| leave | left | left | بەجێدەهێڵێت |
| lend | lent | lent | قەرزی پێدەدات |

| let | let | let | ڕێگای پێدەدات |
|---|---|---|---|
| lie | lay | lain | پاڵدەکەوێت |
| light | lit | lit | دادەگیرسێنیت |
| lose | lost | lost | وون دەکات/ لەدەستی دەچێت |
| make | made | made | دروست دەکات / وا لێدەکات |
| mean | meant | meant | مانای ئەوە دەدات |
| meet | met | met | چاوی پێدەکەوێت |
| put | put | put | دادەنێت |
| read | read | read | دەخوێنێتەوە |
| ride | rode | ridden | سەردەکەوێت ( پاسکیل و ئەسپ ) |
| rise | rose | risen | بەرز دەبێتەوە |
| run | ran | run | ڕادەکات |
| say | said | said | دەڵێت |
| see | saw | seen | دەبینێت |
| sell | sold | sold | دەفرۆشێت |
| send | sent | sent | دەنێرێت |

| | | | |
|---|---|---|---|
| show | showed | shown | پیشان دەدات |
| sing | sang | sung | گۆرانی دەڵێت |
| sink | sank | sunk | دەخنکێت |
| sit | sat | sat | دادەنیشێت |
| sleep | slept | slept | دەخەوێت |
| smell | smelt | smelt | بۆن دەکات |
| speak | spoke | spoken | قسە دەکات |
| spend | spent | spent | بەسەر دەبات / سەرف دەکات |
| stand | stood | stood | دەوەستێتە سەر پێ |
| steal | stole | stolen | دەدزێت |
| stick | stuck | stuck | گیر دەکات / دەچەقێت |
| sweep | swept | swept | ڕادەماڵێت / خاوێن دەکاتەوە |
| swim | swam | swum | مەلە دەکات |
| take | took | taken | دەبات / دەگرێت |
| teach | taught | taught | فێر دەکات / وانە دەڵێتەوە |

| tell | told | told | پێی دەڵێت |
|---|---|---|---|
| think | thought | thought | بیر دەکاتەوە / وادادەنێت |
| throw | threw | thrown | هەڵدەدات / فڕێ دەدات |
| understand | understood | understood | تێدەگات |
| upset | upset | upset | بێزار دەکات / خەمباری دەکات |
| wake | woke | woken | بەخەبەر دێتەوە |
| wear | wore | worn | دەپۆشێت |
| win | won | won | دەباتەوە ( پێش برکێ و یاری ) |
| write | wrote | written | دەنوسێت |

# Active and passive

## بکەر دیار و بکەر نادیار

**ت :بکەر دیار ئەوەیە کە رستەکە بە یەکێك لە دەمەکانی فرمان کرابێت و بکەری رستەکەی تیابێت وەك:**

e.g: Sardar cleaned the room. سەردار ژوورەکەی پاککردەوە.

e.g: They broke the window. ئەوان پە نجەرەکەیان شکاند.

**ت : بکەر نادیار ئەوەیە کە رستەکە بە بەرکار دەست پێدەکات و بکەر یان ئە نجامدەری کارەکەی تیا نیە هەروەها دەبێت فرمانی سەرەکی رستەی بکەر دیار بگۆڕین بۆ شێوەی سێهەمی فرمان واتە ( ed ) وەردەگرێت یان ئەگەر شاز بێت شێوەی تری هەیە وەك:**

E.g: The room was cleaned. ژوورەکە پاککرایەوە.

e.g: The windows were broken. پە نجەرەکان شکێنران.

**ت : ئەگەر ئە نجامدەری کارەکە باس بکەین لە بکەر نادیار ئەوە لە دوای ووشەی ( by ) دێت وەك:**

e.g: The room was cleaned by Sardar. ژوورەکە پاککرایەوە لەلایەن سەردار.

**ت : ئەم خشتەیەی خوارەوە یارمەتیت دەدات لە چۆنێتی دەربڕینی بکەر نادیار، بەلام دەبێت سەرەتا بزانین بکەر دیار چۆنە بۆ ئەوەی بە پێی کاتی ڕوودانی کارەکە بکەر نادیار دروست بکەین واتە دەبێت هەموو ئەو دەمی کارانەی پێشتر لەم بەشە خوێندووتە بیزانیت بە کرداری تاکو بتوانیت لەم بابەتە ڕستەی بکەر نادیار دروست بکەیت:**

| v. دەمەکان tense | بکەر دیار Active | passive بکەر نادیار |
|---|---|---|
| Present simple | Mary helps the boy.<br>Mary helps the girls. | The boy is helped by Mary.<br>The girls are helped by Mary. |
| Present continuous | Mary is helping the boy.<br>Mary is helping the boys. | The boy is being helped by Mary.<br>The boys are being helped by Mary. |
| Past simple | Mary helped the boy.<br>Mary helped the boys. | The boy was helped by Mary.<br>The boys were helped by Mary. |
| Past continuous | Mary was helping the boy.<br>Mary was helping the boys. | The boy was being helped by Mary.<br>The boys were being helped by Mary. |
| Preset perfect | Mary has helped the boy.<br>Mary has helped the boys. | The boy has been helped by Mary.<br>The boys have been helped by Mary. |
| Past perfect | Mary had helped the boy. | The boy had been helped by Mary. |
| Simple future | Mary will help the boy. | The boy will be helped by Mary. |
| be going to | Mary is going to help the boy. | The boy is going to be helped by Mary. |

لەکاتی نەرێنی و پرسیاری بەم شێوەیە دەبێت:

e.g: The boy isn't helped by Mary. کوڕەکە یارمەتی نادرێت لەلاین ماری.

e.g: Is the boy helped by Mary? ئایا کوڕەکە لەلایەن ماری یارمەتی دەدرێت؟

ت: فرمانە یاریدەدەرەکانی مۆداڵ بەم یاسایە دەبن بە بکەر نادیار:

| object + modal + be + p.p + complement |
|---|

e.g: Mary should help the boy. → The boy **should be helped** by Mary.

واتە : ماری پێویستە یارمەتی کوڕەکە بدات.

کوڕەکە پێویستە یارمەتی بدرێت لەلایەن ماری.

Modal Auxiliaries : فرمانەکانی مۆداڵ

(will/would/can/could/shall/should/may/might/have to/must/ought to/had better)

# Comparative and Superlative

## پلەی بەراورد و باڵا

ت: لەکاتی بەراوردکردنی ئاوەڵناوی یەك بڕگەییدا دەبێت ( er ) بۆ پلەی بەراورد و ( est ) بۆ باڵا زیاد بکەین بۆ ئاوەڵناوەکە. بەڵام ئەگەر لە یەك بڕگە زیاتر بوو ئەوە ( more/less ) لە پێش ئاوەڵناوەکە دادەنێین بۆ پلەی بەرواورد و ( most/least ) بۆ پلەی باڵا.

ت/ زۆرجار چەند بزوێن هەبێت لە ئاوەڵناوەکە ئەوەندە بڕگەش هەیە بەڵام چەند بزوێن بەدوای یەك بێن ئەوە حسابی یەك بڕگەی بۆ دەکرێت. بزوێنەکانیش ( a-e-i-o-u ). لە زمانی ئینگلیزی بەهۆی دەنگەوە بڕگە دیاری دەکرێت بەڵام ئەم تێبینییە زیاتر بۆ ئەو کەسانەیە لە دەنگ لاوازن بۆیە پەنا دەبەینە بەر پیت نەك دەنگ.

ت/ئەگەر ئاوەڵناوەکە بە ( y ) کۆتایی هاتبێت و لە پێشییەوە نەبزوێن هاتبێت ئەوە ( y ) دەگۆڕین بۆ ( i ) پاشان ( er/est ) بۆ زیاد دەکەین.

ت/ ئەگەر ئاوەڵناوەکە بە یەك پیتی نەبزوێن کۆتایی هاتبێت و تەنها یەك پیتی بزوێنیش لە پێشییەوە هاتبێت ئەوە پیتە نەبزوێنەکەی کۆتایی دووبارە دەبێتەوە لەکاتی زیاد کردنی ( er/est ).

| adjective ئاوەڵناو | | comparative بەراورد | superlative باڵا |
|---|---|---|---|
| kind | میهرەبان | میهرەبانتر<br>kinder | میهرەبانترین<br>kindest |
| nice | جوان | جوانتر<br>nicer | جوانترین<br>nicest |
| famous | بەناوبانگ | بەناوبانگتر<br>more famous | بەناوبانگترین<br>most famous |
| cheap | هەرزان | هەرزانتر<br>cheaper | هەرزانترین<br>cheapest |

| easy ئاسان | ئاسانتر easier | ئاسانترین easiest |
|---|---|---|
| big گەورە | گەورەتر bigger | گەورەترین biggest |

e.g: He is more famous than his brother. ئەو کوڕە لە براکەی بەناوبانگترە

e.g: He's one of the most famous people. ئەو کوڕە یەکێکە لە بەناوبانگترین کەسەکان .

e.g: This watch is cheaper than that watch. ئەم کاتژمێرە هەرزانترە لەو کاتژمێرە

e.g: Alan is the kindest student among his friends. ئالان میهرەبانترین خوێندکارە لەناو هاوڕێکانی

ت/ دەکرێت ئاوەڵفرمان/ئاوەڵکار بکرێت بە پلەی بەراورد و باڵا بەم شێوەیە:

1 ) ئەگەر ئاوەڵکارەکە بە ( ly ) کۆتایی هاتبێت ئەوە ( more/less ) بۆ بەراورد وەردەگرێت و بۆ پلەی باڵاش ( most/least ) وەردەگرێت.

Quickly → more quickly → most quickly

e.g: The economy of Japan began growing more quickly.

ئابوری یابان خێراتر دەستیکرد بە گەشەکردن .

ت/ ئەگەر ئاوەڵفرمانەکە بە ( ly ) کۆتایی نەهاتبێت ئەوە ( er/est ) وەردەگرێت.

| درەنگ Late | درەنگتر Later | درەنگترین Latest |
|---|---|---|
| زوو Soon | زووتر Sooner | زووترین Soonest |
| خێرا Fast | خێراتر Faster | خێراترین Fastest |
| سەخت Hard | سەختر Harder | سەخترین Hardest |
| دوور Far | دوورتر Farther | دوورترین Farthest |

ت/ ئاوەڵناو و ئاوەڵکاری شاز ( نارێك ) بەم شێوەیە دەکرێن بە بەراورد و بالا :

| Adj/adv | Comparative | Superlative |
|---|---|---|
| good باش | better باشتر | best باشترین |
| bad خراپ | worse خراپتر | worst خراپترین |
| well باش | better باشتر | best باشترین |
| little کەم | less کەمتر | least کەمترین |
| much زۆر | more زۆرتر | most زۆرترین |
| many زۆر | more زۆرتر | most زۆرترین |

**ت: ئەم کورتکراوانە بزانە:**

Adjective → adj ئاوەڵناو

Adverb → adv ئاوەڵکار/ئاوەڵفرمان

**ت/لەکاتی بەراوردکردنی دوو ناو کە جیاواز بن لە شتێکدا یـان کارێکـدا ئـەوە دەتـوانین (than) بەکاربهێنین:**

| Noun 1 + verb + comparative adjective+ than+ Noun 2 |
|---|
| ئاوەڵناوی بەراورد |

e.g: Sara is younger than Saya. سارا گەنجترە لە سایە.

e.g: Ahmed is a better student than Arkan. ئەحمەد خوێندکارێکی باشترە لەچاو ئەرکان

**بەڵام بۆ بەراورد کردنی ناوێك لەگەڵ کۆمەڵە ناوێکی تردا دەبێت (the) بەکاربهێنین لـە پێش ئاوەڵناوی پلەی باڵا:**

The+ superlative adj

e.g: The most interesting film is Troy. خۆشترین فیلم فیلمی ترۆیە.

**ت/ ئەگەر هەردوو ناوەکە یەکسان بوون ئەوە دەتوانی یاسای (as__as) بەکاربێنیت:**

| Noun 1+verb+as adj/adv as + Noun 2 |
|---|

**تێبینی: (adj) واتە (adjective) واتە ئاوەڵناو. هەروەها (adv) واتە (adverb) کە مانای ئاوەڵفرمان دەدات.**

e.g: Sakar is as weak as Ali. ساکار وەکو علی لاوازە .

e.g: Ahmed speaks as quickly as Rawand. ئەحمەد وەکو رەوەند بەخێرایی قسە دەکات.

# Tag Questions

## کلکە پرسیار

ت: کلکە پرسیار بەکاردێت بۆ دڵنیاییکردنەوەو پشکنین لەکاتی قسەکردن بۆ نمونە وەك:

ئارام ئەمرۆ دەڕوات بۆ سەیران، ناڕوات ؟

یاساکانی: ئەگەر ڕستەکە ئەریٚ بێت ئەوە کلکە پرسیار بە نەریٚ دروستدەکرێت، وە بە پێچەوانەشەوە وەك لە خوارەوە هاتووە:

| Positive sentence+ negative tag question? |
|---|
| Negative sentence + positive tag question? |

- Kate will be here soon, won't she? کەیت زوو لێرە دەبێت، ئایا زوو لێرە نابێت؟
- Kate won't be here soon, will she? کەیت زوو لێرە نابێت، زوو لێرە دەبێت؟

| He/she/it + doesn't → does he/she/it? |
|---|
| We/I/they/you + don't → do we/I /they/you? |
| We/you/they/ I +haven't → have we/you/they/I ? |

| We/you/they/ I +have → haven't we/you/they/ I ? |
|---|
| She/he/it hasn't → has she/he/it? |
| She/he/ it has → hasn't she/he/ it ? |

ت: ئەمانەی خوارەوە ئەو فرمانانەیە کە لە کلکە پرسیار بەکاردێن:

(do, does, did, is, are, am, was, were, have, has, had, will, would, should, must, can, could)

-You can't do the work, can you? ناتوانی کارەکە بکەیت، دەتوانی؟

ت/ئەگەر ڕستەکە بە ( let's ) دەستی پێکردبێت و بیکەین بە کلکە پرسیار ئەوە ( shall we? ) دەنوسین:

- Let's go for a walk, shall we?

ت/ ئەگەر بە ( don't ) دەست پێبکات ئەوە بە ( will ) دەیکەین بە کلکە پرسیار.

- Don't be late, will you?

ت/ ئەگەر ( am ) هەبێت ئەوە لە کلکە پرسیار ( aren't I ) بنوسە.

- I'm Kurdish, aren't I ?

ت/ ئەگەر فرمانی یاریدەدەر نەبێت لە ڕستەکە وەك ( verb to be/have/ modals ) ئەوە لەکاتی کلکە پرسیاردا بۆ ڕانەبردوو ( don't/doesn't ) بنوسەو بۆ ڕابردووش ( didn't ).

Doesn't →he/she/it    don't→we/they/you/I    didn't→ subject

-We study English every day, don't we?

- She teaches mathematics, doesn't she?

- He finished the work, didn't he?

# Too & (not) enough

# بەگوێرەی پێویست / زۆر

ت: بەکارهێنانی ( too / enough ) لەگەڵ ئاوەڵناو بە پێی ئەم یاسایەی خوارەوەیە:

| subject + verb to be + too + adj + infinitive |
|---|
| Subject + verb (not) + adj + enough + infinitive |

Infinitive = (to go / to come / to study/ to read/ to finish ….)

- He is too young to go to college. ئەو کورە تەمەنی زۆر گەنجە ( واتە منداڵە ) بڕواتە زانکۆ.

- I am not strong enough to carry this luggage. بەگوێرەی پێویست بەهێز نیم بۆ هەڵگرتنی ئەم جانتایە.

- He isn't old enough to be a college student.

- Sara is experienced enough to do the job.

ت/ هەندێ جار لە دوای ( too/enough ) ئەم دەستەواژەیە دێت ( for someone/something ).

- The car was too expensive for me to buy. ئۆتۆمبیلەکە زۆر گران بوو بۆ من بیکرم.

- The bridge is wide enough for two cars to pass each other. .

ت/ئەگەر لە دوای ( too/enough ) ناو هات یان ناو بەکاربهێنین ئەوە بەم جۆرەیە :

* subject + verb + too much/many + noun +(infinitive)

* subject + verb (not) enough + noun + (infinitive)

- We didn't have enough time to finish the work.

ت/ ( much ) واتـــــــه زۆر کـــــــه بـــــــۆ نـــــــاوی نـــــــەژمێراوە وەك ( work,time,water,milk,coffee ) بەلام ( many ) واتە زۆر کـە بـۆ نـاوی ژمێـراوە وەك ( book - books ).هەروەها ناوی نەژمێراو ( s/es ) وەرناگرێت واتــە کـۆ ناکرێتـەوەو فرمانەکەشی تاکە، بەلام ناوی ژمێراو وەری دەگرێت و کۆ دەکرێتەوە.

ت/ ووشەی ( money- time ) کۆ ناکرێنەوە و ( s/es ) وەرناگرن.

- I have got **too much revision** to do.

- There aren't **enough hours** to revise everything.

- There wasn't **enough money** yesterday.

- There are **too many books** to read.

ت/دەتوانین لە جیاتی ( much ) ووشەی ( little ) بـەکاربهێنین و لـە جیـاتی ( many ) وشەی ( few ) بەکاربهێنین.

- There are **too few hours** to do everything.

- There is **too little revision** to do.

- He has got **too little time** to do his homework.

# Forms of conditional statements

# شێوازەکانی ڕستە مەرجییەکان

1) First conditional form شێوازی مەرجی یەکەم

ت/ ڕووداوی یەکەم ڕانەبردووی سادەیەو ڕووداوی دووەم داهاتووی سادەیە.

| If / As long as + present simple , simple future . |
|---|

یان

| Simple future + if/ as long as + present simple |
|---|

If ئەگەر

As long as بەمەرجێك

- If land is overused, it will often turn into desert.

ئەگەر خاك زۆر بەکاربهێنرێت، ئەوە بەزۆری دەبێت بە بیابان.

- Land will often turn into desert if it is overused.

خاك بەزۆری دەبێت بە بیابان ئەگەر زۆر بەکاربهێنرێت.

- As long as we look after our land, it will <u>be</u> productive.

بەمەرجێك چاودێری بکەین، خاکەکەمان بە پیت و بەبەرهەم دەبێت.

ت/ ئەگەر ( unless ) واتە ( مەگەر ) بەکاربهێنین ئەوە ڕستەی ڕانەبردوو دەبێت ( not ) ی تیا نەبێت و داهاتووش زۆرجار نەرێ دەبێت.واتە ( don't/doesn't ) لە ڕستەی ڕانەبردووی سادە بەکارناهێنرێت:

| Unless + present simple + simple future |
|---|

- Unless you study hard, you won't succeed.

مەگەر بە جدی بخوێنیت، ئەگینا سەرناکەویت .

# Second conditional form

## ڕستەی مەرجی دووەم

| If/as long as + past simple, ڕستەی دووەم |
|---|

ت: لە ڕستەی مەرجی دووەم هەروەك ڕستەی مەرجی یەکەم بیر لە داهاتوو دەکەینـەوە کـە مەرج بۆ حاڵەتێك دادەنێین، بەڵام لە ڕستەی مەرجی دووەمدا ئەو مەرجەی کـە باسـی دەکـەین نەگونجاوە ڕوویدات واتە مەحاڵە بێتەدی و ڕاستەقینە نیە.

ت: ڕستەی یەکەم واتە ڕووداوی یەکەم کە دەبێت ڕابردووی سـادە بێت.ڕسـتەی دووەم واتـە ڕووداوی دووەم کە دەبێت بەم شێوەیە دایڕێژین:

| Subject + would/might/could + base…. |
|---|

ت: دەبێت هەردوو ڕستەکە ئەرێنی بن لە (as long as).

- If I could fly, I would never walk. ئەگەر بتوانم بفڕم، هەرگیز پیاسەم نەدەکرد.
- If it snowed next July, I would be surprised.

ئەگەر مانگی تەمموزی داهاتوو بەفر باری، ئەوە سەرسام دەبم

# Third conditional statement

# ڕستەی مەرجی سێیەم

ت/ ئەم جۆرەیان حاڵەتێکی یان کارێکی ناڕاستەقینە دەردەبڕێت لە ڕابردوودا.

| If + pas perfect , sub + could/might/would + have + p.p…. |
|---|

ڕستەکەی دوای ( if ) دەبێت ڕووداوی یەکەم بێت لە شێوەی ڕابردووی دوور،وە ڕستەی دووەمیش دەبێت ڕووداوی دووەم بێت و لە دوای فاریزەکەوە بینوسین.

دەشتوانین ( if ) لە ناوەڕاستەوە بەکاربهێنین:

| Subject + might/could/would + have + p.p + if + past perfect |
|---|

- If the farmers had known more about the soil science,
they would have saved the farms.

واتە: ئەگەر جوتیاران زۆرتریان بزانیبایە دەربارەی زانستی خاك،ئەوە کێڵگەکانیان دەپاراست.

لە نمونەکەی سەرەوە دەبینین کە حاڵەتەکە ڕوویداوە واتە کێڵگەکان لەناو چوونە لە ڕابردوو و ئێستا مەرجی بۆ دادەنێین کە لەناو نەدەچوون ئەگەر جوتیارەکان شارەزاتر بووایەن.

**ت: زانین و نوسینی فرمانە نارێکەکان ( شازەکان ) بۆ هەردوو ڕستەی مەرجی دووەم و سێهەم پێویستن.**

**ت/ دەتوانین ( if only ) بەکاربهێنین بۆ رستەی مەرجی سێهەم واتە بۆ کارێك کە ڕووی نەداوەو نەهاتۆتە دی.**

# If only + past perfect

**ت: ( if only ) واتە ( خۆزگە ) بۆ دەربرینی پەشیمانی و خەفەتە بۆ کارێك کە بەدڵی تۆ ڕووی نەداوە.**

- If only I had not failed. **خۆزگە نەدۆڕامایە.**

- If only my friends hadn't quarreled. **خۆزگە هاوڕێکانم دەمەقاڵێیان نەکردبایە.**

- If only they had visited the castle. **خۆزگە سەردانی قەلاکەیان کردبایە.**

# Verb + infinitive /ing

**فرمان + چاوگ**

**فرمان + فرمانی ( ing )**

1 ) **لیستی ئەو فرمانانەی ئەگەر فرمان لە دوایانەوە هات دەبێت لە شێوەی ( infinitive ) واتە ( چاوگ ) بێت و ( to ) بەکاربهێنرێت لەنێوان هەردوو فرمانەکە.**

| | |
|---|---|
| پە یمان دەدات<br>Promise | دەتوانێت( پارە )<br>afford |
| ڕەت دەکاتەوە<br>refuse | ڕازی دەبێت<br>agree |
| وا دەردەکەوێت<br>seem | دەیەوێت<br>aim |
| دەیەوێت<br>want | ڕێکدەخات<br>arrange |
| دەردەکەوێت<br>appear | داوا دەکات<br>ask |
| شیاوی دەبێت<br>deserve | هەڵدەبژێرێت<br>choose |
| پلان دادەنێت<br>plan | بڕیار دەدات<br>decide |
| هەڕەشە دەکات<br>threaten | دەدۆڕێت<br>fail |
| دەبێت بە | هیوا دەخوازێت |

| hope | tend |
|---|---|
| فێر دەبێت<br>learn | وا پیشان دەدات<br>pretend |
| بەڕێوە دەبات<br>manage | بانگەشە دەکات<br>claim |
| پێشکەش دەکات<br>offer | پێشبینی دەکات<br>expect |
| ئامادە دەکات<br>prepare | |

- Our old car **appears to have** a lot of problems.

- I **promised not to** be late.

2/ لیستی ئەو فرمانانەی ئەگەر لە دوایانەوە فرمان بێت ئەوە دەبێت (ing) بۆ فرمانەکە زیاد بکەین.

| | |
|---|---|
| risk خستنە مەترسیەوە | succeed in سەردەکەوێت لە |
| avoid خۆ لادان | suggest پێشنیار دەکات |
| can't stand تەحەمول ناکات | give up وازهێنان |
| consider وادانان | put off دوادەخات |
| fancy حەزلێکردن | keep on بەردەوام دەبێت |
| enjoy خۆشی لێدەبینێت | post pone دوا دەخات |
| finish تەواو دەکات | admit ڕێگە پێدان |

| keep دەپارێزێت /بەردەوام بوون | amagine هێنانە پێش چاو |
|---|---|
| mind گوێپێدان | deny ڕەتکردنەوە |
| miss ونکردن | can't help ناتوانیێ یارمەتی بدات |

- We can't **risk driving** it very far.

- I **enjoy getting** up late.

3) لیستی ئەو فرمانانەی لە دوایانەوە فرمان بێت ئـەوە دەتـوانین بـە (ing) یان (infinitive) بینوسین بەبێ گۆڕانی ماناکەی.

| start | دەستپێکردن |
|---|---|
| begin | دەستپێکردن |
| continue | بەردەوام دەبێت |
| hate | ڕقی لێدەبێت |
| like | حەز دەکات |
| love | خۆشی دەوێت |
| prefer | پەسەندی دەکات |
| intend | دەیەوێت |
| bother | بێزاردەکات |

- She started to explain her ideas.
- She started explaining her ideas.

ت: ئەگەر فرمانی ( would ) بەکارهات لەگەڵ ( love/hate/like/prefer ) ئەوە دەبێت ئەو فرمانەی تر بەکاردێت لە شێوەی ( infinitive ) بێت.

- Would you like to come along?

- I'd love to take part in the race.

- He would hate to have been in this position.

4 ) لیستی ئەو فرمانانەی کە فرمان هات لە دوایان دەبێت بە پێی مانای رستەکە ( ing ) یان ( infinitive ) وەربگرن.

| forget | لەبیری دەچێت |
| --- | --- |
| go on | بەردەوام دەبێت |
| mean | مانای وا دەبێت |
| stop | دەوەستێت |
| remember | بیری دەکەوێتەوە |
| regret | پەشیمان دەبێتەوە |
| try | هەوڵدەدات |
| need | پێویست دەبێت |

ت: ( ing ) بۆ فرمانەکە زیاد دەکەین ئەگەر پێشتر ڕوو بدات واتە لـە پـێش فرمانەکـەی پێش خۆی.وە ئەگەر لە دوای فرمانەکەی پێش خۆی ڕوو بدات ئەوە دەبێت بـە ( infinitive ) بینوسین.واتە دەبێت مانا بزانیت.

- She regrets to inform Ako that she can't offer him the job.

ئەو کچە پەشیمانە بە ئاکۆ ڕابگەیەنێت کە ناتوانێت ئیشەکە بە ئاکۆ پێشکەش بکات.

- She regrets saying what she said. She shouldn't have said it.

ئەو کچە پەشیمانە لەوەی ووتویەتی.ئەبوایە ئەو قسەیەی نەووتبایە.

## (Used to + infinitive without *to*)

## ڕاهاتبوو بە

ت/ ئەم یاسایە بەکاردێت بۆ کارێك لە ڕابردوو کردوومانەو ئێستا نایکـەین یـان بەکـەمی دەیکەین.

* positive ; subject + used to + base + complement
* negative : subject + didn't use to + base + complement
*Question : Did/ Didn't + subject + use to + base + complement ?

- I used to watch cartoons when I was child. But now I don't .

بە منالی تەماشای فیلم کارتۆنم دەکرد.بەلام ئێستاکە تەماشای ناکەم.

e.g: He didn't use to work hard. ئەو بە سەختی کاری نەکرد.

e.g: Did you use to watch cartoons when you were child?

ئایا تەماشای فلم کارتۆنت دەکرد کاتێك منالْ بوویت؟

## *some* and *any*

some هەندێ

any هیچ

| | | |
|---|---|---|
| some | لە ڕستەی ئەرێ بەکاردێت ( بەواتای هەندێ ) | I've got **some** plasters.<br>We've got **some cheese.**<br>There are **some** students outside. |
| any | لەڕستەی نەرێ و پرسیاری دێت.( بەواتای هیچ ) | I have<u>n't</u> got **any** plasters.<br>We have<u>n't</u> got **any** cheese.<br>Have you got **any** plasters<u>?</u><br>Have you got **any** cheese ?<br>Are there **any** students outside? |

# How much and How many

- **How many** بەواتای ( چەند ) کە لەگەڵ ناوی ژمێراو بەکاردێت.

*How many children are there?*

**چەند منداڵ لەوێیە؟**

***How much…?*** بەواتای ( چەند ) کە لەگەڵ ناوی نەژمێراو بەکاردێت

*How much sugar do you want?*

***چەندێ شەکرت دەوێت؟***

## The 24-hour clock

## سیستەمی 24 کاتژمێری

| Am | بەیانیان / صباحا |
|---|---|
| Pm | پاش نیوەڕوان-ئێواران- /مساء |
| Midnight | نیوەی شەو ( کاتژمێری 12 ی شەو ) |
| Noon | نیوەڕۆ ( کاتژمێری دوانزە ) |

| 12 midnight | 00.00 | 12 noon | 12.00 |
|---|---|---|---|
| 1 am | 01.00 | 1 pm | 13.00 |
| 2 am | 02.00 | 2 pm | 14.00 |
| 3 am | 03.00 | 3 pm | 15.00 |
| 4 am | 04.00 | 4 pm | 16.00 |
| 5 am | 05.00 | 5 pm | 17.00 |
| 6 am | 06.00 | 6 pm | 18.00 |
| 7 am | 07.00 | 7 pm | 19.00 |
| 8 am | 08.00 | 8 pm | 20.00 |
| 9 am | 09.00 | 9 pm | 21.00 |
| 10 am | 10.00 | 10 pm | 22.00 |
| 11 am | 11.00 | 11 pm | 23.00 |

3.45 pm = 15.45

9.15 pm = 21.15

2.30 am = 02.30

8.10 am = 08.10

# بەشی سێهەم

# Everyday words and phrases

# وشەو دەستەواژە باوەکانی ڕۆژانە

## 1) Talking about language

## قسەکردن سەبارەت بە زمان

| Grammar words<br>ووشەکانی ڕێزمان | Meaning<br>واتاکەی | Examples<br>نمونە |
|---|---|---|
| noun (n.)<br>ناون | ناو | book, girl, pen |
| verb (v.)<br>ڤێب | فرمان | speak, listen, read, write |
| adjective (adj.)<br>ئاجێکتڤ | ئاوەڵناو | nice, beautiful, good, bad |
| adverb (adv.)<br>ئادڤێب | ئاوەڵفرمان | nicely, well, fast, quickly |
| preposition (prep)<br>پرێپەزشن | ئامرازی پەیوەندی | in, on, at, from, by |

| singular<br>سینگیولە | تاك | book / foot |
|---|---|---|
| plural<br>پلورەڵ | کۆ | books / feet |
| phrase<br>فرەیز | دەستەواژە | at home, an old man |
| sentence<br>سێنتەنس | ڕستە | I want to learn English. |
| paragraph<br>پارەگراف | پەرەگراف | This book has useful parts. Each part has its own importance. |
| dialogue<br>دایەلۆگ | دیالۆگ ( گفتوگۆ ) | Ali : How are you?<br>Sara : I'm fine, thanks. |
| question<br>کوێسچن | پرسیار | Are you Kurdish ? |
| answer<br>ئانسە | وەڵام | Yes , I am.<br>No , I am not. |

## 2) Have / had/ had

**فرمانی ( have )**

I have breakfast at 7:00 am. لە کاتژمێر حەوت نانی بەیانی دەخۆم.

**ئای هاڤ برێکفەست ئەت سەڤن ئەی ئێم.**

I have lunch with my family. لەگەڵماڵەوەمان نانی نیوەڕۆ دەخۆم.

**ئای هاڤ لەنچ وذ مای فاملی.**

I had dinner at 7 pm yesterday. دوێنێ لە کاتژمێر حەوت نانی ئێوارەم خوارد.

**ئای هاد دنە ئەت سەڤن پی ئێم یەستەدەی.**

I like to have tea in the morning. بەیانیان حەزم لە خواردنەوەی چایە.

**ئای لایك تو هاڤ تی ئن ذە مۆنینگ**

I had a sandwich. لەفەیەکم خوارد.

**ئای هاد ئە ساندویچ**

He doesn't have a bath every day. ئەو کوڕە خۆی ناشوات هەموو ڕۆژێك.

**هی دەزنت هاڤ ئە باث ئێڤری دەی**

Do you have a moment? کاتت هەیە؟

دو یو هاڤ ئە مەومنت

I want to have my hair cut. ئەمەوێت قژم تەراش بکەم.

ئای وۆنت تو هاڤ مای هێیە کەت

Mary is having a baby next month. ماری منداڵی دەبێت مانگی داهاتوو.

ماری ئز هاڤینگ ئە بەیبی نێکست مەنث

## * Have + got

## هەبوون

( Have got) بەمانای ( هەبوون )ی شتێك لە زمانی قسەکردن بەکاردێت.بەڵام ( have ) بە مانای ( هەبوون )ی شتێك لە زمانی نوسین بەکاردێت.

e.g: I **have got** some friends. هەندێ هاوڕێم هەیە.

e.g: She **has got** two brothers. ئەو کچە دوو برای هەیە.

e.g: We'**ve got** a nice house. ماڵێکی جوانمان هە یە.

e.g: He'**s got** a headache. ئەو کوڕە سەر ئێشەی هەیە.

e.g: I **haven't got** any problems. هیچ کێشەم نیە.

e.g: **Have** you **got** a pen? قەڵەمت هەیە؟

Yes , I have. بەڵێ هەمە.

No, I haven't نەخێر نیمە.

# * Have to

(have to) بە مانای پێویستە دێت کە بۆ حاڵەتێك بەکاردێت دەبێت کارەکە بکەیت و بـۆ ئیلزامکردنە کە لە زمانی نوسین و قسـەکردن بـەکاردێت.هـەروەها هاوماناکـەی بریتیـە لـە فرمـانی (must) کـە زیـاتر لـە زمـانی نوسـین بـەکاردێت و واتـای پێویسـتە دەدات (بـۆ اجباری)بەکاردێت.

e.g: The museum isn't free. You have to pay money to go in.

مۆزەخانەکە بە خۆڕایی نیە. دەبێت پارە بدەی بۆ ئەوەی بڕۆیتە ژوورەوە.

e.g: All the students have to do the exam.

هەموو خوێندکارەکان پێویستە تاقیکردنەوەکە بکەن.

e.g: He has to walk to school because he hasn't got a car.

ئەو کوڕە دەبێت بە پێ بڕوات بۆ قوتابخانە چونکە سەیارەی نیە.

## 3) Go / went / gone

ئەو ووشانەی لەگەڵ ئەم فرمانە دێن ئەمانەی خوارەوەن:

I go to work at 8:00 am. لە سەعات هەشت دەچم بۆ ئیش.

ئای گەو تو وێك ئەت ئەیت ئەی ئێم.

She went in her room. ئەو کچە ڕۆشتە ژوورەکەی.

شی وێنت ئن هێ ڕووم.

She went out of her room. ئەو کچە ڕۆشتە دەرەوە لە ژوورەکەی.

شی وێنت ئاوت ئەڤ هێڕووم.

I went up the stairs slowly. لە قادرمەکان بەهێواشی ڕۆشتمە سەرەوە.

ئای وێنت ئەپ ذە ستێیەز سلەولی

I go down the stairs quickly. لە قادرمەکان بەخێرایی دەچمە خوارەوە.

ئای گەو داون ذە ستێیەز کویکلی

I'm going back this evening. ئەم ئێوارەیە دەگەڕێمەوە.

ئامگەوینگ باك ذس ئیڤینینگ

